# جاشکۆڵەی

## بێنمەک

ناوی کتێب: جاشکۆلەی بێنمەک

دانانی: واریسی ئەلکندی

وەرگێڕانی: ئەحمەد زەردەشت

هەڵەچن: ڕەووف مەلایی

بڵاوکراوەی: بوڕاق بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

دیزاین و جێبەجێکردن: کۆمپانیای نوور

نیگار: تەیێبە عەبدوڵلا

ڕەنگی ژمارەیی: هودا نەعیم

سەرپەرشتی هونەریی: محەمەد ئەلقاسمی

تیراژ: ٥٠٠٠ دانە

ISBN: ٩٧٨-٩٦٤-١٩٢-٣٤٨-٠

چاپی یەکەم ٢٠١١



**ژمارەی سپاردن بە دەزگای کتێب و بەڵگەنامەکان- بەغدا (١٤١١) ساڵی ٢٠٠٩**

Web site: www.alburagh.com E-mail: Info@alburagh.com

له یەکی له کێڵگه دوورەکان و نزیک به چیا سەوزەکان، که لوتکەکانیان پۆشاکی سپی به بەفر پۆشی بوو، کۆمەڵه کەروێشک و هەندێ ئاژەڵی ماڵی وەک مریشک و تەیر و توور، پێکەوه دەژیان و شاره خنجیلانەکەیان ڕازاندبۆوه... ئەڵبەته شوێنی یاری و سەیران و پیاسه و خۆشی لێ بو، بێچووی کەروێشک و ئاژەڵەکانیتر لەوێ کۆ دەبوونەوه و پێکەوه یارییان بەو یاریيانه دەکرد که خۆیان به کۆتەڵەدار دروستیان کردبوون، ئێواره هەمووان دەگەڕانەوه ماڵی خۆیان پشوویان دەدا و دەنوستن، به هیوای ڕۆژێکی نوێیەتری پڕ له کاری ڕاستەقینه و چالاکی و خۆشی.

خەپلـەی خـۆری ڕۆژێکـی نوێ لە ئاسـۆوە بـە زەردەخەنەیەکـی پرشـنگدارەوە دەرکەوت و تاڵە تیشـکە گەرمەکانـی بـەرەو ماڵی کەروێشـکەکان ڕیشـەی دەکێشـا... لە لایەکی نزیـک بە کێڵگەکەوە، مریشـک و کەڵەشێرێکی خنجیلانە و جوان گوزەرانیان دەکرد، کاکی کەڵەشێر دەچوو بۆ کار و گەڕان بە دوای پارویەک نان‌دا، کەرویشـکەکان، لەگەڵ خوێندنی بەرەبەیانی کەڵەشـێرەکە ڕادەپەرین و خۆیان بۆ ڕۆژێکی نوێ ئامادە دەکـرد... هەریەک لـە کەروێشـکەکان، لەگەڵ خوێندنـی بەرەبەیانی کە ڵەشێرەکە ڕادەپەرین و خۆیان بۆ ڕۆژێکی نوێ ئامادە دەکرد...

هەر یەک لە کەروێشـکەکان، بەرەو کاری خۆیان دەبوونەوە و هەندێکیان لە کێڵگـەی گوڵ و گوڵزارەکەدا کاریان دەکرد، هەندێکیشـیان خەریکی ئاودێری و گەیاندنی ئاو بوو بۆ کێڵگەی گوڵزارەکە، لەم نێوانەدا یەکێکی‌تر بنە ڕوەکێکی‌تری نوێ دەچەقاند... پۆلی هەنگ لە شاخەکانی دەور و پشتەوە پۆل پۆل دەدەن بەسەر گوڵزارەکەدا و شـیلەی گوڵەکان دەمژن و هەنگوینی خۆش دا دەهێنن ئەڵبەتە هە نـگ حـەزی لە گوڵـزار و خاوەنەکانێتی .. کاتێک لە گەڵ ئەوانەدا دەبێ هەسـت بە ئاسـوودەیی دەکات، تەنانەت کەروێشکەکانیش هەنگەکانیان خۆش دەویست.

ڕۆژێکیان جاشەکەرێکی بچووک کە ناوی جاشکۆڵە بوو، زۆر هیلاک و شەکەت بوو، ئەڵبەتە شێر و گورگ شوێنی کەوتبوون، کەروێشکەکان داڵەیان دا شاردیانەوە و جۆ و سەوزەجاتیان دایە و تێر ئاویان کرد، جاشکۆڵەکە هەستی بە حەسانەوە و تێری و ئاسوودەیی کرد، پاش چەند ڕۆژێک گەورەی کەروێشکان پێی گوت، گەر دەتەوێ بە ئاسوودەیی و هێمنی لە ناوماندا بمێنێتەوە ئەوا بەشێک لە کێڵگەکە بچێنە وئێمەش یارمەتیت دەدەین لە بنیاتنانی ماڵێکی خۆش کە تیایدا بژیت.

جاشکۆڵە بیری لەوە کردەوە کە
چۆن لەگەڵ دانیشـتوانی ئەم شارۆچکەیەدا بژی،
بـەڵام بیرکردنەوەکـەی دوژمنانـە بـوو، وای دەزانـی
کەرویشکەکان لێی دەترسن و گوایە خۆی بەهێز و گەورەترە،
هەر بۆیە دەبێ دەسـت بەسـەر داهاتی کێڵگە و
ئاو و سـەوزەجاتەکەدا بگـرێ و خۆی بە
پادشـا دامەزرێنـێ، بەهێـز و دڵ
ڕەقییـەوە حوکمرانێتـی بکات هەر
بۆیـە بـە فیزێکـەوە بـە ڕێـگادا
دەڕۆیشـت و پا و لاقـی بـە
گوڵەگەنم و جۆ و سـەوزەدا
دەنـا و گوڵەکانـی پـان
دەکردەوە.

کەروێشـک و دانیشتوانی شارە خنجیلانەکە و گوڵە ناسک و نازدارەکان، ئەم ڕەوشت و کردارانەیان لا سـەیر بـوو، لێیان دەڕوانـی، کاتێک لـە کانیە ئاوە ساف و سـازگارەکەدا خۆی دەشت و لێڵ و پیسی دەکـرد، ئینجـا لـە بـەر خۆرەکـەوە بەسـەر گوڵزارەکانەوە خۆی هەڵ دەخسـت و دەنوسـت وێرانـی دەکـرد. بـە هەڵپە گوڵەگەنـم و جۆکانی دەخوارد و لە پاشان دەزەڕی و گۆرانی دەچڕی.

کاتێک بەو دەنگە ناخۆش و ناسازەی دەیزەڕان و بە فیزەوە دەڕۆیشت پەلی نا بەسەر ماڵی مریشکەکەدا، ئەڵبەتە ئەویش چەند ڕۆژێک بوو بەسەر هێلکەکانییەوە گڕ کەوتبوو، چاودێری هێلەکەکانی دەکرد بەو هیوایەی هەڵبێن و جوجەڵەی بچووکی جوان بەرهەم بێنێ. کولانەکەی خاپوور کرد و هێلکەکانی شکان، کەڵەشێر و مریشکەکە بەو کارەی جاشکۆڵە زۆر خەمناک بوون، گیروگرفت و کێشەی کرداره وێرانکاریەکانی ئاڵۆزتر بوو لە شاری کەروێشکەکاندا، ئەڵبەتە ئەوان بە ئاسوودەیی و ڕێکوپێکی دەژیان، ئاژەڵی شارۆچکە خنجیلانەکە کۆ بوونەوە و بیریان لە پلانێک دەکردەوە کە چۆن نەجاتیان بێت لە جاشکۆڵە، بڕیاریان‌دا کە گەورەی کەروێشکان لەگەڵ کەڵەشێرەکە بچنە لای جاشکۆڵە بەوە ڕازی بکەن کە واز لە کێڵگەکە بێنێ و بڕوات

گەورەی کەروێشکان و کاکە کەڵەشێر چن لەسەر شان چوونەلای جاشکۆڵە کە بەسەر گوڵەکانەوە پاڵ کەوتبوو، تەنانەت وەڵامی سڵاوەکەشی نەدانەوە و بە فیزێکەوە وتی چیتان دەوێ؟ زوو قسە بکەن و بڕۆن، کەروێشکەکە وتی.. داڵدەمان دایت و لە ئاژەڵە دڕندەکان پاراستمانی، ئەی گوایە دەبێ بەم جۆرە شارەکەمان وێران کەیت؟!

کەڵەشێرەکەش وتی: ماڵەکەمت وێران کرد و هێلکەکانمانت شێلا و شکاندنت و کێڵگەی گوڵزارەکانت وێران کرد، ئەی گوایە ئیتر چیت دەوێ؟

جاشکۆڵە دڵتەنگ بوو، بە تووڕەییەوە وتی: من پاشاتانم و دەبێ لە فەرمانی من دەر نەچن، ئەی ناکەسە لاوازەکان..

کەروێشک و کەڵەشێرەکە بە نائومێدییەوە گەڕانەوە و سەرگوزوشتەی جاشکۆڵەیان بە ئاژەڵان ڕاگەیاند، مریشکەکە وتی: با دان بە خۆماندا بگرین، یەکی لە کەروێشکەکان وتی: با خانوویەکی بۆ بنیات بنێین و پارچە زەوییەکی بۆ بچێنیین، بەشکم وازمان لێ بێنێ، کەڵەشێرەکە وتی: بەڵام ئەو دەیەوێ ببێ بە پادشایەکی ستەمکار بەسەرمانەوە.

لەم کەین و بەینەدا پۆڵە هەنگەکان بەوناوەدا بڵاو بوونەوە، کە سەیریان کرد کێڵگەکە تەختە و گوڵەکان شۆڕ و سیسن و خەم برادەرەکانیانی داگرتووە، ئەم بارەیان لا سەیر بوو، لە ئاژەڵەکانیان پرسی چی ڕوویداوە؟ گەورەی کەروێشکەکان ڕووداوەکانی بۆ گێڕانەوە، مریشکەکە بە گریانەوە وتی هاوڕێیان یارمەتیمان بدەن.

شـاهەنگ وتی: بەڵێ دۆسـتان ئێمە یارمەتیتان دەدەین و ئەو جاشـکۆڵە سـتەمکارە دەر دەپەڕێنیین، ئەڵبەتە دۆسـت لەکاتی تەنگانەدا دۆسـتە، شـاهەنگ وکۆمەڵە هەنگەکان کەوتنە بیرکردنەوە و دانانی پلانێکـی وا کـە دەری پەڕێنن. بەرەو جاشـکۆڵەکە بوونەوە، هەندێکیان دایان بـە پەل و قاچەکانیەوە و هەندێکیتریـان لـە پەنـا گوێیـدا کەوتنە ویزەویـز و هەندێـک دایـان بە پشـت و شانیەوە...

هەر چەندێ کۆشا
نەجاتی بێت، لەو پێوەدانە
پڕ ئازار و ویزەویزو
هاژەهاژە ناخۆشەکە هاکا مێشکی لە ئازاردا
دەتەقی، نەیتوانی. هەر بۆیە دایە غار بەرەو
دارستانی ئاژەڵە دڕندەکان ئەو
دارستانە کە لێەو هات، ئاژەڵەکان
پێ خۆشحاڵبوون سوپاسی هەنگەکانیان
کرد و بڕیاری ئاوەدان کردنەوەی ئەو
شوێنانەیان‌دا کە جاشکۆڵە بێ نمەکەکە
وێرانی کردن، شارۆچکەی کەروێشکان
سەر لە نوێ گەشەی سەندەوە و خۆشی
و شادی بۆ گەڕایەوە.

ئەمە لەبەر کە
پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ
"نەفام ستەم لەوانە دەکات
کە تێکەڵیان دەبێت و دەست
درێژی دەکاتە سەر ئەوانەی
لە خۆی نزمترن"
هاوڕێیانی ئازیز
دیمان کە چۆن جاشکۆڵە کاری کرد و ستەمی لە کەروێشکەکان
کرد و شارە جوانەکەیان کە بە هیلاکی و شەو نخوونی بنیاتیان نابوو شێواندی ،
چۆنیش کەروێشکەکان یارمەتییان دا و هەموو شتێکیان پێشکەش کرد و ویستیان جۆری
بیرکردنەوە نەفامەکەی ڕاست کەنەوە، بەڵام بێ سوود بوو. ئەڵبەتە ڕەوشتێکی ناپەسەندە
گەر ستەم لەوانە بکەین کە لە خۆمان لاوازترن، دەبوایە کاری خۆی بکردایە و بەشداری بکات
لە بنیاتنانی شارەکە و بە ئاسوودەیی و خۆشەویستی لەگەڵیاندا گوزەران بکات چونکە لە
کاتی تەنگانەدا دەستی یارمەتییان بۆ ڕاکێشا، جا ڕاتان چییە گەر یەکێک دەستی
یارمەتی بۆ ڕاکێشــان وخۆشەویستی بۆ نواندن... چۆن پاداشتی
دەدەنەوە؟
ژمارەی ئەو پارچانەی خوارەوە لە شوێنی خۆیدا دانێرەوە
١
٢
٣
٤
٥
٦
٧
١٢